# ئاڵەکۆک

## هەژار

بە کوردی پێت دەڵێم لێم مەگرە ئیراد
دیاری شوانە وێڵە ئاڵەکۆکە

## ناوەڕۆک

## وتەیەک

خوینەرانی بەڕێز!

ئـەو کۆمەڵـە شـێعرەی لـە بـەر دەسـتتان دایـە و نـاوی ئاڵـەکۆکی لـە سـەرەگووراوی بـیر و هەسـتی هۆنـەری پسـپۆر و هەڵـکەوتەی موکریان،ژوورتر لەوەش ئی هەموو گەلی کـوردە. نـاو هـەژار و موکریـان وکوردسـتان لێـک جیابوونـەوەیان نیـە. ئـەو کەسـەی کـە بـە حـەق نازناوی‌شاعیری میللی بۆ داندرابوو.

هەژار بەو بەرهەمەی کە ئاڵەکۆکە شۆڕشێکی ئەدەبی بەرپا کرد،شـێعری کوردی لە بارودۆخێکی غەرامی و سوفیانە بـەرەوبارودۆخێکی نەتەوایـەتی ئەو دیوا و دیو کرد.

شێعری هەژار و کۆماری کورد لە ساڵی ١٣٢٤ کۆچی خورشیدی‌پێکەوە چاویان بە دنیای سەردەم هەڵێنا. کاریان کـردە سـەر یـەک ویـەکتریان قایم کرد، بە رووکاری مێژوودا هاتنە خوارێ و خەباتی‌کوردیـان ئـاودێری کرد.

شێعری کوردی لـە موکریـان بـەر لـە پشـکوتنی ئاڵـەکۆک بـریتی بـووە لەبەسەردا خوێندنی خاڵ و لەب و قەد و خەد و لەنجـە و لار و عیشـوەو ناز کە لە عیشـقی حـەقیقی‌وە عیشـقی مـەجازی داخۆیـان نواندوەسـێ شاعیری هەرە گەورەی موکریان وەفایی و حەریق و ئەدەب هەرسـێکیان لەو بەستێنەدا وزەی خۆیان بە تاقی کردۆتەوە یان بەجوانێکی ئاسمـانی و بە هەشتیو پیرێکی ئاهوراییان دا هەڵکەتوە یان‌بەژنێکی ئاسـایی و پـەری خۆمانەیەکی کوردیان‌دا هەڵکوتوە. کەم‌وابوە ئاوڕێک بدرێتەوە سەر ژیانی

واقیعی جەماوەری کورد ئەگەرتاکو تەرایەکیش وەک خالـەمین و سـەیف لایەکیان لـە کـورد کردبێتـەوەیان لـە ژێـر پـەردە و پەرژینـدا بـوە یـان نەکەوتۆتە زار و زمانان وەسرنجی گشتی بۆ لای خۆی رانەکێشاوە.

جیا لە خەیاڵ و مانا و ناوەڕۆک دەکارهێنانی وشەی کـوردی رەسـەن‌و بێگرێ دیمەنێکی دیکە لە شێعری هەژارە کە هۆنراوەی کوردی لەچەنگی شاعیرانێکی رەق وێـژ و مەتەڵوکەسـاز و چـاو لـێ کـەر هێنـادەرێ. لـێ دوانێکی ساکار و بێ گرێ و گۆڵ بەڵام توند و تۆڵ وسەنگین و رەنگین لە وەبەدوا رێگەی بۆ نوێ خوازانی کوردی وێژوەک هـێمن و سـوارە تـەخت کرد.

خوێنـەری ئـەو کۆمەڵـە شـێعرە رەنگـە بـە سـەر سـوڕمانەوە بنواڕێتـە ئەوشـێعرانەی کـە هـەژار تـاریف و پەسـنی بالشـویکی، ئیسـتالین، شۆڕەوی‌دەکات. بەڵام لە ڕستەیەکی کورت و سەربەست دەبـێ بزانـدرێ ئەوسەردەمەی هەژار شێعری تێـدا کوتـوە سـەردەمێکی جیـاواز بـوە لـە گەڵئێستادا وە هـەژار خـۆی لـە جێشـتی مجێـوردا ئامـاژە بـەو هەڵـەیە دەکات‌و پێی لە سەر دادەنێ بەشەرە و هەزار شتی سـەیر و سـەمەرە بـۆ کەس‌دەتوانێ بڵێ دەور و بەر کارم تێ ناکـا، ئـەوەش بڵـێین وەک بـاقی کارەئەدەبیەکانی خوالێخۆشبوو هەژار، سۆز و عاتیفە و ئـاخ و خۆزگەبۆتـە هەوێنی زۆربەی ئەو شێعرانە تەنانەت ئەوانەشـیان کـە بـە قـەد وباڵـای ئیستالین‌دا هەڵدەڵێ بۆیە تا وەکوو ئێسـتا لـە زەیـنی زۆرێـک لـەپیاوە پیرەکانی کوردی موکریانی‌دا هەر ماوەو پاش ئەو هـەموو زوڵـم‌و زۆرو و قەدەغـە و قۆرغانـە لـە سـەر سـەفحەی زەینیـان‌دا نەسـڕاوەتەوەو نـە

شۆراوەتەوە.  ئەوەش دار و لە لەیەکی باشە بۆ ئەوەی شێعری‌چاکی پێ بە تاقی کەیەوە کە  داخوا چلۆن شێعری چاک جێی خۆی‌دەکاتەوە لە نێو دڵی خەڵکدا.

هەڵبەت شێعری ئەو دەفتەرە هەموو شێعرەکانی سەردەمی کۆماری‌مامۆستا هەژار ناگرێتەوە هەر وەکوو چەند شێعرێکی ئاخیری ئەودەفتەرەش بۆ هەوەڵین جارە لە گەڵ ئاڵەکۆک  بڵاو دەبێتەوە ئەو چەندرستەیە بۆ نیشان دانی هەل و مەرجی هەڵقوڵانی ئەو شێعرانەیە دەنائەگەر هەموو کارە ئەدەبیەکانی هەژار لە پەخشان، هۆنراوە و وەرگێڕبخەینە بەر باس لە رادەی توانای ئیمە بەدەرەو بەحر ناخرێتە نێوجەررەوە ئیمەش دەبێ بە قەد بەڕەی خۆمان پێ راکیشین.

## ژیاننامەی هەژار

شاعیری بە ناوبانگی موکریان عەبدوڕڕەحمانی شـەرەفکەندی کـوڕی حاجی مەلا محەممەد لە بنەماڵەی حەسەن خاڵیە کە تیرەیێکی مـاقوڵ و نێوبەدەرەوەی کوردی موکریان بوون.

حاجی مەلا محەممەد پیاوێکی بەدین و لە خوا ترس بـوو لـەعلوومی دینیدا زانا و بە مەعلوومات بوو. لە پاش ئەوە کە لە خویندن تەواو بووە لـە سابلاغ دانیشتوە و بە کار و کاسبی خۆی بەڕێ چووە ومنەتی حکوومـەت یا خەڵکی هەڵنەگرتووە. لە کاتی تەحسیلدا زیاترلە کوردستانی عوسمانی کۆن (عێراق و تورکیای ئێستا)دا رای‌بواردووە.

زوڵم و زۆری عوسمانی لە گەڵ نەتەوەی کورددا بە چاوی‌خۆی دیوە و لە جەرگی کاری کردووە و لە دواییشدا کە لە سابلاغ‌بووە بە بێئینسافی و بێروحمـی کاربەدەسـتەکانی حکوومـەتی ئێـران‌دیسـان برینـەکانی کولاوەتەوە.

پیاوێکی نیشتمان پەروەر بـووە فـەجایعی زۆردارەکـانی ئەغڵـەبلـە پشتی کتێبەکانی خۆی بە جۆرێکی وا بێگانە تێی نەگەن نووسیوەئەمن بۆ خۆم چەندێک لەو بیرەوەریانەم دیـوە بەڵـام داخەکـەم وەخـتو زەمـان یاریـدەی نـەداوە بـوێرێ و بتوانـێ یادداشـتەکانی کۆکاتـەوە. ئەوهـەموو گەوهەرە بە نرخانە لە نێو چوون!!

هـەژار کـە لـە منداڵـیەوە لـە ژێـر ئامۆژگـاری باوکیـدا بـووە هەستی‌نیشتمان‌پەروەری و نەتەوایەتی فێـر بـووە و هـەر لـە منداڵـیەوە ئاشقی‌چیای بەرز و سەرسەوز و ئاوی سارد و دیمەنی بێهاوتای‌کوردسـتان

بووە و هەمیشە بە چاوێکی نیشتمانپەروەری تەماشایدەشت و دەر و دار و بەرد و کێو و هەردی کوردستان ئەکا. وەکوو ئەڵێ:

مـــــــــانگی بانەمــــــــــەڕ لــــــــــە کــــــــــوردەواری
بەهەشـــــــــت لـــــــە دنیـــــا خـــــۆی داوە دیــــاری
کـــــەژ پۆشـــــی لــــە گـــوڵ چـــــادرەی ســـــوور و زەرد
هـــــــــاڕەی هەڵــــــــــدێران دەرمانــــــــــە بـــــــۆ دەرد

هـەژار زۆر چـاک تێگـەیوە کـە نیشـتمانی کوردسـتان لـە گـەڵ ئـەو هەمووسەفای خودادادی و جەماڵی تەبیعەتە لە لایەن کانگـە و مەعـدەن ومەودای ئەووەلییە شەوە کە بناغەی گوزەران و ژیانی دنیایسەنعەتکار و موتەمـەددینی ئەمڕۆکەیـە گـەلێ دەوڵـەمەند و دارایـە ودڵـی بـۆ ئـەوە دەسووتێ کە نەتەوەی کورد ئەسیرە و ناتوانێ لەنیشتمانی خـۆی بـەهرە وەرگرێ...

نیشـــــــتمان تـــــــۆ چـــــــی؟ بەهەشـــــــتی بـــــــەرین
لــــــە کـــــوێ دیاریـــــت دا؟ لــــە ســــەر روی زەمــــین
خـــــــــاک و خۆڵـــــــــەکەت زێـــــــــڕ و زەنبـــــــــەرە
نـــــــەوتت روونـــــــاکی شـــــــەوی بەشـــــــەرە
کـــــــەژ و چیاکـــــــەت ســـــــەوزەی رووی دڵـــــــبەر
جۆگـــــــەکانت چـــــــن؟ هـــــــەنگوین و شـــــــیرین
منداڵـــــــــــەکانت عەبـــــــــــد و ئەســـــــــــیرن

هەژار خاوەنی فکرێکی ئینقلابیـە بـۆ نـەجاتی کوردسـتانخۆشەویسـت و خۆشبخەتی برا و خۆشکانی نەتەوەی کورد بووەفرێـدانی هێنـدێ خـو و خەسـلەت و رێ و شـوێنی کـۆن و فـەرتوت کـەماک و مایـەی

دووبەرەکایەتین بە پێویستی دەزانێ و پتر خراپەی ئەوجۆرە شتانە دەڵێ و ئەزیەت و ئازاری زەمانی دیکتاتۆریان وەبیردێنێتەوە و لە پەردەی لۆمەدا بانگیان دەکا بۆ یەکیەتی و نیشتمانپەروەری:

میللەتێک هەن لە نێو مەعاشیرەت
خۆ بە خۆ شێر لە غەیرە بێ غیرەت
خوێنی یەک نۆش دەکەن لە مەیدانان
وەک پیاڵەی شەڕابی مەیخانان
بیری سەربەستیان لەلا بایە
هەر تەماحە ئەوی لە کارایە
پیاوی زلیان کە هەڵبڕێ نەفەسی
بە قڕانی قڕان دەخاتە کەسی
کامە ئاغا بوو کێهە مەزنی زل
نیری عەڕڕابەیان دەنا سەر مل
لاوێ لەم عەردە جێی نەبوو نازی
کێ بە شەق لێی ئەدا لە سەربازی
بەند و لێدان و حەبس و تێهەڵدان
مێوەڕۆنێ بوو بۆ لەشی کوردان
چەندهەزار کوێر و شەل، چەنێرەشورووت
هات و چاوی بە ماڵی کورد پشکووت

هەژار لە زوڵم و زۆری دیکتاتۆری زۆر تووڕەیە سوپای سـوور لەماشـێنی ئیستبدادی تێکشاند لە شێعرەکانی هەژاردا باسی زۆرە،فڕۆکەی شـۆڕەوی بە موجەسسەمەی شـادی تەشـبیە کـردەوە فریشـتەی‌ئـازادی نەتـەوەی کوردی بە سەرنشینی ئەو داناوە و ئاه DEL و نزولـەی ژن‌و منداڵـی زەلیلـی کوردی بە دەلیل و رێ و نیشاندەری ئەو فریشتەیەداناوە.

چ فـــــــــڕۆکێک؟ موجەســــــــــــەمەی شـــــــــادی
کێــــــــی تێـــــــدا بــــــــوو؟ فریشـــــــــتەی ئــــــازادی
ناڵـــــــــــەی بێـــــــــوەژن هـــــــــەتیوی زەلیـــــــــل
لــــــە رێگـــــــای ئــــــەم فریشـــــــتەیە بوونـــــــە دەلیـــــل
بــــــــــــۆ بــــــــــــیرەوەری لــــــــــــە رۆژی دیلــــــــــــی
بۆیــــــــــادی دەمـــــــــــــی کـــــــــــزی و هـــــــــــەژاری

## دەمەتەقەی عەقڵ و بەخت

چی‌یە ئەم هۆنراوە؟ عەقڵ و بەخت
ڕەهنومای لاوەکانە بۆ سەر تەخت
دوێشەوێ بێخەوی سەری لێدام
زۆر وەڕەز بووم لە عاجزی هەستام
چوومە لای پیرە عەقڵی نازارم
دیم لە گەڵ بەخت و تەبعی سەرشارم
سێبەسێ وەک برا بە دەستی جەم
کۆزیان کردبوو لە دەوری شەم
گوفتوگۆیان هەبوو چی‌یە و چ خەبەر
خۆم پەنادا کە تێگەیشتم سەر
پاکی یا باسی عەیش و نووشی دڵ
یا ڕەها کردنی گرێی موشکڵ
عەقڵم ئەیپرسی بەختم ئەیدا جواب
تەبعم ئەی‌هۆندەوە بە ئاب و تاب

## پرسیاری عەقڵ لە بەخت

ئەی بەخت قەرنەهایە تۆ نوستووی
سەد کڵاو بردی با لە خەودا بووی

خەو وەها ئاوڕیشت بوو دەستە و یەقە
هەڵنەدەستای بە زەبری مست و لەقە
لە کەژی بەند و بەستی سەرکەوتن
تۆ پەکت خست بە تەنبەڵی و خەوتن
نەم دەزانی کە بەختی کوردی هەژار
وەخەبەر دێ چلۆنی وا بێدار
بە چ دەنگێ بوو ئاشنا گۆشت
کێ هەڵی ساندی لە خەوی خۆشت
وەرامی بەخت بۆ عەقڵ
من لە غورڕابی خەو وەک ئەیزانی
هاتە خەونم پیاوێ نورانی
لە شەهیدانی ڕێگەیی میللەت
ڕۆشنی تاریکە شەوی زیللەت
ئەو نەمامە لە مێژ بوو نێژرابوو
گەیبوو سێبەر و بەری دابوو
کوتی ئەی نووری دیدە هەستە لە خەو
موژدە بێ کەوکەبت دەدا پەڕتەو
ئەوی ئەندامی کۆمەڵی بە تەمان
هەر بینا بەم زووە سەری لێدان
بو گزەرێنن جیهان بە کەیف و سروور
دێ بە سواری فرۆکی ئەرتێشی سوور

بێت و قەدری نەگیرێ وەک جاران
پێو دەناسن کونەرەشی تاران
تووشی بەدبەختیان دەبن دیسان
دەچنەوە بەر جنێوی دەم پیسان

**راپەرینی بەخت لە خەو**

راپەڕیم لەو خەوەم دەدا تەعبیر
لە نەکاو دیم وتاری مامی پیر
(هەر چلۆنی ئیشارەتی فەرموو
وەک کەرامەت هەمووی وەها دەرچوو...)
هات بە گرمە فرۆک لە لای مەسکەو
بۆ عەجەم وەک شەهێن دەچێ بۆ کەو
هەڵمەتێکی گەیاندە تەختی جەم
تێکیدا شەوکەت و جەلالی جەم
بە بڵاو بوونی دوو پەڕ ئاگاهی
بوو بڵاو ئەرتێشی شەهەنشاهی
شاکە شێر بوو لە راوی مسکیندا
دیم کە مشکە لە ژێر ستالیندا
ئەوەی خواردی گەرووی جەفا و جەوری
دی فرۆکە و رشایەوە فەوری

چ فرۆکێک؟ موجەسسەمەی شادی
کێی تێدابوو؟ فریشتەی ئازادی
دەعوەتی کردوە پیرەدایکی وەتەن
خزمەتی کەن کوڕان بە ماڵ و بەتەن
نەگرین قەدری وەک هەوەڵ بۆمە
نی‌یە تەنکاوی گۆمە ئەو چۆمە
ئەو فریشتە چلۆنە تۆ خوا بەخت؟
یەکێ گەردن فیرازە بازوو سەخت
دەبەری دا لیباسی سوڵتانی
لە سەری ئەفسەری کەریمخانی
قەدی رازاوە کردووە خەنجەر
مەنزەری جوانە جوانترین مەنزەر
ئەردەشیر، شیری داوەتێ بە خەڵات
تا لە بێگانە هەڵوەژێرێ وەڵات
زەڕڕەیەک هیممەتی وی ئەلبورزە
کوڕی مەیدانی خەنجەر و گورزە
نەتەوی شێخی گورگی زاهیر میش
زیددی دەروێشی پرچ و سوفی ریش
ئەو کوڕی پێدەوێ لە مەیدانێ
روو بە مردن بچێ و سەری دانێ

بێبەشی هەر ڕەزایلە زاتی
حیفزی ناموسە کار و سەنعاتی

عەقڵ :
بەخت :بچمە کوێ زیارەتی بکەم حاسڵ
ڕاستە بازاڕی ڕوح ئوتێلی دڵ
کێهە دڵ ـ قەڵبی نیشتمانپەروەر
هاتووە چەندێکە چۆنە نایەتەدەر
کوردەکان زۆرە چاوەنۆڕی ئەون
دوور لەوی خاکەسار بە ڕۆژ و شەون
زوڵمی بێگانەکانی ڕوو ناخۆش
بەحری ڕوحمی ڕەحیمی هێنا جۆش
ئاهی زیندانیانی کوردی فەقیر
پەڵەهەوری لە ئاسمان بوو گیر
ئەم پەڵەهەورە بوو بە بارانە
هاتە سەر خاکی ئەم موکریانە
ڕێژنە بارانەکەی بەدەست و برد
ئاوپڕشکێنی ڕێی فریشتەی کرد
ژن و منداڵی باب و مێرد کوژراو
ناڵەیان خستەڕێ بە ناو و داو

نالەی بێوەژن هەتیوی، زەلیل
لە ڕێگەی ئەم فریشتە بوونە دەلیل
بەو هەموو دەردە پاش هەموو دەردان
پەری ئازادی بێتە نێو کوردان
کەس هەیە حورمەتی بە دڵ نەگرێ؟
یان دەبەر تۆزی کەوشەکەی نەمرێ؟

وەرامی بەخت
میللەتێک هەن لە نێو مەعاشیرەت
خۆبەخۆ شێر لە غەیرە بێغیرەت
خوێنی یەک نۆش دەکەن لە مەیدانان
وەک پیاڵەی شەرابی مەیخانان
بێنە شەر خۆبەخۆ هەزار و ڕۆستەم
بەرگەیان بگرێ زەحمەتە و حەستەم
هەرکە تورکێ کوتی چەکین داڵی
کونە مشکێ لەوان نیە خاڵی
پیشەیان مونحەسیر دزی کردن
ڕێگری و ماڵی یەکتری بردن
ئەوی دەستیان کەوێ حەرام و حەڵاڵ
وشتری ساڵح و کەری جرجاڵ
دەیرفێنن نیە چ ڕا هیچ پرس

نە لە خۆیان حەیا نە لە خوا ترس
ئەوی بڕنووی لە شانە دەیبینی
پاکی بۆ ڕێگری برای دینی
بیری سەربەستیان لە لابایە
هەر تەماحە ئەوی لە کارایە
پیاوی زلیان کە هەڵبڕێ نەفەسی
بە قرانێ قران دەخاتە کەسی
باسی بێ بیریان بە سەد نووسەر
عوشری میعشاری نایەتە دەفتەر
خۆت دەزانی عەجەم لەوان چی کرد
ماڵ و نامووسی چهای ستاندو چی برد
کۆنە بیلێم حیکایەتی دمدم
سەرگوزشتە و نەزیلەی سارم
باسی ئەم دەورە خۆ لە بیر ماوە
گەورە دێڕێک بوو گەردە نووسراوە
چەند ئاغا بە نێوی حەبسی نەزەر
گاو و گەردوون کران و بڕیان سەر
نێفەکی چەند کەسان بڕا بە ئەتک
ملی چەندان هەلاوەسا بە پەتک
چون سمایل بوو هەوەلین قوربان
بۆیە قوربان کرا سمایل خان

کوا قەدەم خێر بە دەستی کێ ون بوو
عیلی گەڵباغی بۆ سەرەوبن بوو
تیلەکۆیی بە کێ کراون کز
باقیە نەقڵی دارەکەی سەقز
دێتەوە بیری حەزرەتی ئاغا
کە بە عیبرەت دەهات بە سابلاغا
شارەبانی لە دوو دەسەو نێزە
جەرگی مەخلووقی بۆ دەبوو رێزە
کامە ئاغا بوو کێهە مەزنی زل
نیری عەرڕابەیان دەنا سەر مل
لاوێ لەم عەردەجێی نەبوو نازی
کێ بە شەق لێی ئەدا لە سەربازی
بەند و لێدان و حەبس و تێهەڵدان
مێوە رۆنێ بوو بۆ لەشی کوردان
چەند هەزار کوێر و شەل چەنێ رەش‌ورووت
هات و چاوی بە ماڵی کورد پشکووت
دز دەهات دز بگیر نیشانی و ناو
بەردە زوورەی دەکردە ئاو بۆدراو
مەسلەخێ رۆنرابوو ئەمنییە
مەتبەخی نێو نرابوو سوڵحییە
هەچی چوو سەربڕا لە هەووەڵ باب

لە دووەم جێگەدا کرا بە کەباب
ئیقتساد موقتەسید بوو بۆ ئینساف
قاف ئەلەرزی لە دایرەی ئەوقاف
هەنگ و دژبان و راهDEL و فەرماندار
دوپشک بوون و ببوە مارئامار
ئەوەی دەیکرد لەوان فەلاحەت و بانک
وای لە ئاڵمان نەکروە تۆپ و تانک
سەبتی ئەملاک و ئیزدواج و تەڵا
بەدری کوردی نەجیبی خستە محاق
شارەبانی و گومرک و بەیتاری
لە عەجەم هەر کەسێ هەبا زاری
خوێن مژی مامە کوردە بوو پیشەی
تا دەرێنێ لە بن رەگ و ریشەی
ئیفتزاحاتی دیش لە هەر قیسمەت
من بە خۆڕایی خۆم دەدەم زەحمەت
پاک بەحر ببنە حیبر و مێشە قەڵەم
نادرێ شەرحی زوڵم و زۆری عەجەم
کە فەلەک وەر گەڕا بە تەردەستی
نۆرە گورزیان نرایەوە مستی
حەقی چەند ساڵە کۆنە و فەوتاو
هاتەوە چنگی کوردەکان بە تەواو

چونکە بێ بیر و مەست و بێهۆشن
ئەم حەقەی خۆ بە پارە دەفرۆشن
هەر حەقێ یەک بە سەد گەوهەر بێ
کێ بە پارەی دەدا مەگەر کەر بێ
کامەیان دەوڵەمەندە مەرد و رەند
تۆنێ نامووس دەدا بە تۆنێ قەند
کێهە یەگجار نەجیب و ژیر و کوڕە
دەچتە سەودا شەڕەف دەدا بە شڕە
میللەتێکی حقووقی چەند ساڵی
تۆلەی نامووس و دینی وماڵی
بیفرۆشێ بە چیت و قەند و پوڵ
چۆن ئەوان ئەم فریشتەیانە قەبووڵ
یان فریشتە بەوانەیە قانیع
کە ببن هەر ئەون لەرێ مانیع
تا ببن وا ئەوان مەکە ئەندێش
نەگەڕێتەوە دواوە بێ بۆ پێش
کورد وەبێ حاڵی وا بێ ئەحواڵی
نایبینی چاوەنۆڕ بی سەد ساڵی
ئەم جارە بەخت هەڵدەگەڕێتەوە

له عەقڵ دەپرسێ
ئەم سەعاتەی کە هەم بە بێداری
هەر ببم یا بنووم بە یەکجاری؟
بش خەوم ئەم کەڕەت هەتا مەحشەر
بە خەویش نابینن ببم بە خەبەر
لەم دوو فکرانە ئێستە داماوم
یانی لەم گێژی بەحرە خنکاوم
پیرە عاقڵ ئەتۆ لە مێژینەی
بۆ فکر لێم یەقینە گەنجینەی
بە تەنێ تۆ دەوای هەموو دەردی
بە سەهو و ناچی ئەلحەقی مەردی
چی‌یە چارە لە قیس نەچێ ئەمرۆ
رایەڵەی کارمان نەبێ بێپۆ
شوێنێ کار تێک مەدە بەوەستایی
بیکە یەک لا هەزار و دوو لایی

عەقڵ دوای بیر کردنەوەیێکی زۆر کە دیتی ئاغا چارەی ناکرێ وای فەرموو:
رێگەی حەللی عەقدی ئەم ئیشە
کە ببێ هەر فەقەت تەوا ریشە
یانی خوا رووسەکان مووەففەق کا

جەرگی هیتلەر بە تیغی وان شەق کا
بێتە جێ رووس تەواوی پێویستی
دەورەدا نێوی شومی فاشیستی
راوەنێن بۆ دەرەک سوپای رومێل
نەزمی دنیا بدەن رەئیس و ئێل
شوان و گاوان و مالک و جوتێر
چووک و زل یانی کاسب و بێخێر
لێکی دەن لێکی کەن لە یەک ئانا
سووک و سەنگین نەبێ لە میزانا
تەختی کەن سەخت و ماهی سەرسەختی
دێتە تەپکە نچیری خۆشبەختی
بێقڕە و بێفڕەو پەلەقاژە
خۆش دەڵێ شاعیری دەری واژە
**«بالشویکی است خضر راه نجات**
**بر محمد و آله صلوات»**
ناوی پیغەمبەرم کە هێناو ئال
بە هومێدم کە بێنە جێ ئامال
بە خەتاو میسک کە نازانی
دەبێ لەم تونگی شەکرە بڕوانی

دوڕ دەبارێ (هەژار) لە ئەشعارت
ئەی دریغا نی‌یە خەریدارت

**دوو باز پێکەوە**

دوێنێ ئەو دەمەی کۆچی دەکرد شەو
بۆ موژدەی بەیان لە قاسپەی دا کەو
چوررە پۆپنە کەوتەوە سەما
بە هێز دەیسیڕاند رۆژە شەو نەما
چاوی خەواڵووم لە خەو راپەڕان
چوم بۆ دەشت و دەر بۆ سەیر و گەڕان
چاوم پێکەوت بە زەردێکەوە
گوفتوگۆیان بوو دوو باز پێکەوە

بازی یەکەم
برادەر تاکەی ژینی خۆڕایی
وێڵگەرد و چۆڵ بڕ دوور لە ئاوایی
تەواوی ژینت قەڵشە بەرد جێتە
کێوی زانیوتە نەزان و شێتە
شمەک چلکن و ئەندام دژوێنی
لە کوێ شیو دەکەی تێدەوەشێنی
چیاو و کەژ دەگری دەفڕی لە خۆوە
کەوێک قووت دەدەی بە پەڕ و پۆوە
نەخواردەمەنیت پوخت و پاراوە
نە هەرگیزماڵت گەسک دراوە

نە کوورە و کورسی بە سارد و سەرما
نە باوەشێنیێ لە جەنگەی گەرما
شەو بە تاریکی لەو چۆڵ و هۆڵە
سەرینت بەردە و دۆشەگت خۆڵە
بە گاڵەی کوندێ دەنووی سەری شەو
بە ناڵەی درنج هەڵدەستی لە خەو
نە ژەمێکی باش دێتە بەر دەستت
نە کەس ئاگادار لە نیست و هەستت
هەزار نەخۆشی و سەر ئێشە بگری
بێ داو و دەرمان نەش مری دەمری
لە کاری چەتوون کێ یاریت دەکا
کێ لە راست دوژمن داشداریت دەکا
کەواکەت شڕ بێ کێ بیکا پینە
ئەوە سەگ مەرگە هەر نێوی ژینە
ئەمن وەک تۆ بێپیشە و ئاکارم
لێم نابیەی بلێم تیرەی باڵدارم
بۆ ئاسوودەیی هیچ تێناکۆشی
بۆیە لە ژینت نابینی خۆشی

بازی دووەم

تا بشتم نیە مەمشێلە ئیدی
بە تەوس و پلار مەمکوژە چیدی
لەت لەتە جگەر لێم مەدە تەشەر
سەد هێندی کوتت بێکەسم و بێدەر
ئەتۆ وەکوو خۆم نازانی من چیم
بە چەند ئاخ و داخ لە دنیا دەژیم
پێم خۆشە ئەمنیش وە خۆشی گەڕێم
ئەگەر دەزانی کوانێ شوێن و رێم
دەرمان کە دەردم برای چاکم بە
تا دەمرم برام ئەتۆ کاکم بە

بازی یەکەم

پێت خۆشە تووش بی شوێنی رزگاری
لە گەڵ من وەرە بچینە شاری
لە کۆشکی شادا پاڵکەوە بێخەم
لە گەڵ کوڕی شا دەبیتە هاودەم
لە سەر تەختی زێڕ هەڵنیشە تاوێ
لە سەر دەستی شا بچۆرە راوێ
لە بەر بریسکە هەڵنیشە بە شەو
گوێت لە شمشاڵ بێهەتا کاتی خەو

له بان لیسی زێو به سه‌رینی قوو
بنوو به خۆشی هه‌ر به‌یان به‌ربوو
سه‌رپه‌نجه‌ت ده‌کوشن هه‌ڵت ده‌سێنن
سنگه مریشکت به‌رچا بۆ دێنن
زه‌نگوڵه‌ی زێڕت له قاچی ده‌که‌ن
زڕه باڵت بێ هه‌ڵپاچی ده‌که‌ن
چه‌ن ماڵ ته‌رخانی رۆژی پێویستیت
له کن شا له رووی زۆر خۆشه‌ویستیت
جێگایه‌ک بێشێ چ ژوور چ ده‌رت
چل ده‌رمان فرۆش ده‌گاته سه‌رت
کاتی سه‌رما و سۆڵ له په‌نا سۆبه
راکشێ و ده‌تشێلێن نۆکه‌ر به نۆبه
به چله‌ی هاوین گه‌رما و کوڵه‌کوڵ
نیسێت لێ ده‌کا شا به چه‌تری گوڵ
هه‌ر مانگی تۆنێک شه‌کر بۆ چینه
ده‌ت ده‌نێ کامی سپیه و شیرینه
هه‌رچی ده‌ته‌وی هه‌رزان و تاڵان
ده‌سا بابده‌ین له شه‌ققه‌ی باڵان

بازی دووەم دەپرسێ
ئەو شارەی گوتت شاری بازانە؟
پاشای ئەو شارەش بازی چازانە؟
دەست و پێوەندی هەموو هەر بازن؟
لە ڕێی نیشتمان سەر پردە بازن؟
ئەو شەکری گوتت باز دەیدا بە پیاو؟
باز دەمان داتێ کە باب و پڵاو؟
دەرمان باز دەیکا ساز بۆ زام و ئێش
دەس کوژی بازە دەمان هێننە پێش
تەختی زێڕ، زێڕی خاکی خۆمانە
وەستای زەنگی زێر کاکی خۆمانە
باز هەڵی دەکا چرا بە شاباڵ
بازە لێدەدا بلوێر و شمشاڵ
بە زمانی بازان دەمان دوێنن
بە رووی خۆشەوە دەکارمان دێنن
بۆ باز ڕاو دەکەین کەوی بۆ دەگرین
لە خاکی خۆمان دەنێژرێین بمرین؟

بازی یەکەم
ئەوە تۆ شێتی یان وا دەنوێنی
ئەو وتانە چن دەیان راوێنی
کەی باز شای بووە تا ئێستە بی بێ
بیسراوە کێوی تانج و تەختی بێ
کوا ئەو هۆشەیان دروست کەن شاران
هەر بازیان گوتوە ماڵ لە نزاران
چۆن پیاو نەخوێنی هەڵدەکا چرا
هۆشت لە کوێیە بەشخورا برا
ئێمە و دروست کەین لیسی زێو بۆخۆ
بۆ هۆش و خۆشت هاوار و رۆڕۆ
زانستی دەوێ دروست کەی چەتر
خوێندنی دەوێ کارخانەی شەکر
دەندوکی بازی بۆ شمشاڵ نابێ
زێر لە خاک دەرهێن دەبێ زانا بێ
ئێمە و زەنگی زێر دەنگ بداتەوە؟
پێم وایە گێژی خەو دەتباتەوە
ئەوانە بۆمە گەلێک حەستەمن
ئەوی من دەلێم رۆڵەی ئادەمن
خوێندنیان هەیە و رێگا دەزانن
ئارەزووی هەر کار بکەن دەتوانن

هەموو تیرەیەک براو کۆمەڵن
لە داوای بەشدا لە مەیدان کەڵن
خوێنیان دەرێژن لە سەر تۆزێ بەش
لە رێی ئازادی بێسەر دەکەن لەش
فرۆکەیان هەن کە لێی دەخوڕن
ئەوان لە ئێمە چاتر دەفڕن
گەڕۆکیان هەیە خۆی ببزوێنێ
هەزاری وەک مە بە جێ دەمێنێ
شتێکیان هەیە کاری کارەبا
وتەی کوێستانی بۆ گەرمێن دەبا
لە هەر کوێ بدوێن لێرە گوێت لێیە
پاک دەنگ و باسی سەر زەوی پێیە
کوڕیان دەنێرن پیشان فێر دەبێ
هۆز ئەگەر وابێ گر چوو تێر دەبێ
زێڕی خاکی مە ئەو دەری دێنێ
نەوتی ئێمەیە ئەو دەیسووتێنێ
کن هێلانەکەت پڕە لە جیوە
دارستانەکەت خڕە لە میوە
زەڕنیقی تۆیە لە پێشتی دەبەن
خوێی خاکی تۆیە لە چێشتی دەکەن
دەکاری دێنن بە خۆبەخۆیی

تۆ کەنگێ کردت گردەوە کۆیی
بنێشتی تۆیە دەیکەن بە ئامراز
بەبەنی خۆتە دەدروون چاوی باز
پێویستە ئێمە وشەی وان فێربین
لە کاری وان‌دا ئازاو دلێر بین
سەد هەزار بازی تیژباڵ و راوی
بوونە نۆکەریان تۆ بە جێ ماوی
سەر بەستی بۆ باز چۆن دەبێ کاکە
ئەوی من دەڵێم وا بکەی چاکە

بازی دووەم
کەوا بێ هۆش و بەستە زمانین
بێکارە و خوێڕی و جێگەی گەمانین
پیشەی وان بۆمە ریگەی تێ نەبرێ
پاشا لە بەر چی ئێمە رادەگرێ
ئێمەی بۆ دەوێ بە کاری چی دێین
بۆ ئەو نازانێ ئێمە چین و کێین
لە رووی چی بۆچی؟ بۆ خوشەویستین؟
بۆ کام کاری ئەو ئێمە پێویستین؟

بازی یەکەم
تۆ ئەورۆ برام هۆشت لە کوێیە
باسی رۆستەمە نێرەیان مێیە
ئەمن پێم گوتی ئەو خاک و موڵکە
ئەگەر تۆ هەتە بۆ ئەو بە کەڵکە
گیانی خاکەکەت دەکێشێ بۆ خۆی
دەزانی خاوەن ئەگەر بێ ئەتۆی
چاوت دەبەستێ هەر ئەو بناسی
رێت لێ ون دەکا کورت و بڵباسی
دەتنێرێتە راو کەوی بۆ بگری
مەرگ بۆ ئەو هات، دەبێ تۆ بمری
بە شەڕمان دەدا بە یەکمان دەگوژێ
بۆ سەر خۆشی خۆی خوێنی مە دەمژێ
ئێمە هەر بۆیە دەکا پەروەردە
لە گیانی یەکتر ببینە جەردە
دەبێ رووی خۆشت دەگەڵ بنوێنێ
تا دین و دنیات لە چنگ دەردێنێ
بازی دووەم
ئەوا تێگەییم لە کاری گێتی
ئەم جارە گیانە من تۆم پێ شێتی
ئەوەش دەزانی و بۆشیان خەریکی
لە پیکیش دەدەی هەم لە ماپیکی

ئەوی تۆ دەیکەی من بم کردایە
نێویان دەنام کەر لە سەر دنیایە
چ دەبێ نەچی نۆکەری شاکەی
دەس کەی بە کار و روو لە خوڵاکەی
بێی لە گەڵ منا بچینە رازان
بۆ برایەتی ببینین بازان
لە دەوری یەک لەو چیا بەرزانە
هەرچی باز هەیە بکا هێلانە
لێک کۆبینەوە و شارێ بکەین ساز
خوێندن دابنێین بە زمانی باز
هەموو جوچکمان پێیان بخوێنین
لە سەر پیشەو کار دایان مەزرێنین
دەندووکیان تیژکەین بۆ مێشکی دوژمن
دەرکەین نەتەوی لە سوچ و قوژبن
هەرچی دەمان بێبەختی کەین لە خۆ
دەقات زیاد بکەین باڵ و پەڕ و پۆ
پیرۆزەی پیرۆز پێی بەرین پەنا
لە ژێر سایەی خۆی بمان کاتە شا
ئیدی نەچیە لای دوژمنی خوێنی
لەو بابەتەوە ئەمجار نەمدوێنی
نامووس باشترە لە باب و دایی
ئەو نی‌یە بۆیە دەکەی گەدایی
هەتا نەمان بوو وەک تۆ هەناو کەم
باز بوو دەی بەخشی تانج و تەختی جەم

باز بنیشتبا لە سەر سواڵکەرێ
دەبوو بە خاوەن تەخت و ئەفسەرێ
سەد دار پیر دەبوو بە ئاواتەوە
جارێک باز ئەوی بە سەر کاتەوە
ئێستە تۆمان هەی بۆیە تەواوین
بۆیە لە کن سەگ پیس و گڵاوین
دڵخۆشیم دەدەی، دین و دنیاکەم
بۆ تۆزێ شەکر پێش کێشی شاکەم؟
بڕۆ تۆ ڕەگی مە ردیت مردووە
نا زانی زانا چۆنیان فە رمووە
پیاو کێوان بەشان بگوێزێتەوە
ئەندامی لە نێو خوێن بتلێتەوە
لە بری نان بخۆی خۆلەمێشی بۆر
ژەهری هەلاهیل بکەی بە پێخۆر
بۆ کەوش درووە بکەیتە سەر پێ
بچیتە ناو خیز لەباتی دەر پێ
زستان وشکە بەند هەڵت لەرزێنێ
هاوین جەنگەی کار نۆبەتێت بێنێ
کەوای نەداری بکەیتە بەرت
کڵاو بە بزمار بدەن لە سەرت
لە گەڵ ئەژدیها بت پێچنە نێو غار
لە چاڵت بخەن لە گەڵ سەگی هار
هەموو خوێی دەریا بکەیتە چاوان
سەد ساڵ بەندی بی بێ سووچ و تاوان

باڵت بوەرێ پەک بخا بۆ راو
هێلکەت بگنخێ لە بەر سوورە تاو
بە سەری پیری دە جوچکت بمرێ
چەنگاڵت کۆڵ بێ کەوێکی نەگرێ
وێڵگەرد و بێ جێ گەڕان لە هەردان
لەسەر خۆڵ خەوتن سەر لەسەر بەردان
لە رژدو سەختا هێلانە کردن
نەوەک نۆکەری بێگانە کردن
من کە ئەوەم بیست مات و سەر گەردان
بیری رووناک و بازی بن بەردان!
دیارە باڵندەش هیندێک بەبیرن
هێندێکیش لە ناو نەزانی گیرن
کە خورد بووم دیتم ئەو دوو باڵدارە
یەکێک ئاغایە و یەکیک هەژارە

## بیست ساڵەی هەژاری

بیست ساڵان لە ژێر چەنگاڵی عەجەم
ناڵاندم بە سەد دەردو هەمم و غەم
کێوی بەختمان دایگرتبوو تەم
کەس یارای نەبوو بێژێ ئەمن هەم
رووس نەجاتی دام بوو بە فریشتەم
بژی ئیستالین خۆش بی چەکچ و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

بیست ساڵان کزو بێکەس و بێدەر
گوزەرانم کرد بەخوێنی جگەر
دین و ژیانم لەدەس چوبوەدەر
کورد بوو دەناڵی لەقەسری قەجەر
رزگاری کردم بەیرەقی ئەحمەر
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچ و داس
لەژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

بیست ساڵ پێم نەکرا نەفەس بکێشم
ئاگام بڕابوو لەقەوم و خوێشم
نەدەکرا بدوێم لە گەڵ هاورێشم

قورتی نەگبەتی دەهاتە پێشم
رووس بووبە مەڵحەم بۆ زام و ئێشم
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچو داس
لەژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

بیست ساڵان لە بەرزوڵم و زۆری زۆر
دەرگای شادیمان لێکرا بوو مۆر
دڵ پڕ لە زام و جگەر پڕ ناسۆر
جەفاو بێ روحمی دەرچوو بوو لەشۆر
تا ستارەی سوور هەڵات وەکوو خۆر
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچو داس
لەژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

بیست ساڵ دوور خراین لە نیعمەت و ناز
موکری لە شیراز شکاک لە ئەهواز
گۆشتی بەدەنیان دەپچڕین بە گاز
رووس بۆی پێک هێنام ئاوات و ئاواز
بەیداخی رەحمەت کەوتە ئیهتزاز
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچو داس
لەژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

حوکمی پەهلەوی و سیخورمی مەئموور
کوردی دەپێکا لە نزیک و دوور
خوێنیان دەمژتین بەسەد چەشن و جوور
چەند هەزار ماڵی کورد کرا خاپوور
رەحمەت بوو بۆمان کەهات سوپای سوور
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچو داس
لەژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

زیندانی قەسر دەخمە بوو بۆ کورد
راماڵیان دەداین درشت هەتا ورد
لە سەر برینمان دەکرا دەس و برد
کەلاک و لەشیان دەکردینەوە پرد
پەنجەی ئیستالین ئێمەی رزگار کرد
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچ و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

لە ساڵی یەکرا هەتا وەرزی بیست
مژی خوێنی مە ئێرانی فاشیست
فەوتانی مەبوو ئامانج و پێویست
مرا هەرچی بوو برا هەست و نیست
لێی دەفع کردم حیزبی کمۆنیست

بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچ و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

بیست ساڵی تەواو کوردی چارەڕەش
بە دەس دەوڵەت بوون لە گیان بێبەش
دێوی بەدبەختی گرتبونیە باوەش
هەر کورد دەکوژرا و دایک سەر بەهەش
موژدەی خۆشی بوو ئاڵای سوور و گەش
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچ و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

کوردە پێت خۆشە نەبی رەنجەڕۆ
لە رێی ئازادی تۆش نەبی کوڵۆ
دەجاڵت نەوێ بە فێڵەو دەهۆ
کارت پێی نەبێ سانفراسیسکۆ
خۆڵی وەسەر کە لە دەرکی موسکۆ
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچ و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

کوردە پێت خۆشە بژی سەربەخۆ
پەنا بەبۆ رووس ئیتر خەم مەخۆ
سەعیی و کۆششت ناچێ بە فیڕۆ
هەر بەو ساز دەبێ خودموختاری تۆ
رووس وەک خەڵکی نین بۆت بڵێن درۆ
بژی ئیستالین خۆش بێ چەکچ و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەڵاس

**ڕەوابیتی فەرهەنگی**

کاتێ بای وەعدە دەستی کرد بە خوڕین
دەی و ئیسفەندی وەدەرنا لە کەمین
وشکە پووشی دەر و دەشت پۆشی‌یەوە
لەجێگای کفنی سپی ماوەتی شین
بەرقی شەمشیری بە رق خۆی دەرخست
ئاوی کانیاوی لەترسان تۆقین
زێوی گۆی دالدّە بەتاڵان ڕۆیی
بوو بە نەغدینەیی لالە و نەسرین
دای لە بێڕلینی رنوو دوورزەنی هەور
چۆن لە بێڕلینی دەدەن موتەفیقین
ئەرتەشی سووری شەقایق وەک رووس
هیتلەری بەفری وەدەرنا لەزەمین
عەرزی پڕ کرد لەعەتر بادی سەبا
وەک بەزە و عەدڵی رەفیق ئیستالین
بەهەزار وەزنێ هەزار شێعری دەگوت
گەیبووەریزی هەژار و پۆشکین
گولە شلێرە لە قەبران مل‌کز
بۆ براکانی شیمال دەیکرد شین
پەلی چاڵووکی بەسووری دەتگوت
چەنگی تورکانە بەخوێنمان رەنگین

گوله خاش خاشه جەرگ ڕەش بۆ کورد
شەتڵی خوێن هەروەکوو شێخی شەمزین
گوتم ئەی بەختە هەتا کەی تا چەند
تۆ خەواڵووبی ئەمەش دڵ غەمگین
کەی دەبێ هەوڵێ بدەی هەڵبگری
سەر، سەری ئێمە، سەری خۆت لە سەرین
یانی زستانی خەمان کەی دەڕوا
یا کەنگێیە بەهاری زانین
کەنگێ قەل لاقی لە باغت دەبڕێ
بولبول و بازی دەبن جێگەنشین
بەفری نەگبەت کە لەسەرمان باری
بەشنەی عیلمی لەعەرزی دەبڕین
کەنگێ باغ و گوڵی دین و نامووس
بۆوە پێپەست نەبێ دەکرێ پەرژین
کەنگی عەرزێکی دەکێڵێن بۆ تۆ
کەنگێ تۆوێکی دەچێنین بۆ شین
کەنگێ چینراوی دەگاتە بەر و بۆ
کەی بەباهۆی کوڕە کوردێکی دەژین
هەر لە کۆڵ بێتەوە سواری کەرە شەل
نامەوێ ئیدی بە ماشێن بفڕین
هەرچی خەڵکی زەویە لیسانسە

چ دەبێ ئێمە زمانێک فێر بین
گوتی بۆ ـ بێخەبەری ـ لەو بەینە
چاوەڕێی رابیتەیی فەرهەنگین
دەوڵەتی شۆڕەوی یان کەوکەبی بەخت
ئەوی سەرمەشقی هەموو خۆشی لەوین
بەیرەقی سووری بە رووسوری نواند
زەهلەیان پێی چووە هار و بەدبین
لەپەنا کوتکی عەداڵەت کێشای
داسێ بۆ هەژگەڵی زاڵم دوورین
بۆ نەجات دانی ئەسیرانی جیهان
خوێنی رشت میللەتی واخوێن شیرین
کە لە ویجدان و عەداڵەت داری
بۆ فەقیران و زەعیفانە موعین
تا لەرووومان هەڵێ نێو خەڵکی چوون
بەرگی زانستی بە بەردا کردین
تا زمانێک بێ کە پێی هاوار کەین
بۆ حوقوقمان و نەڵێن کورد وەحشین
سازی کرد یانەیی زانست بۆمان
با وە رووح بێینەوە چیدی نەمرین
کە برینداری بە کێردی دیلی
کوردە هەر خوێندنە دەرمانی برین

زەرد و ماهێک بوو کە لێی سەر کەوتین
بە هومێدم پتریش سەربکەوین
بۆ هەموو کوردی وڵات پێویستە
کە ببێژێ بە سەدای بەرز و مەتین
بۆ هەژار پەروەری و عەدڵ و داد
بژی ئیستالین و شاد بێ لینین

## جێژنی ئیستقلالی ئازەربایجان

دەمێک بوو دەشت و دەر یەخسیری ئیستبدادی زستان بوو
ئەوی چووبێ بە دەردی کوردی مەزلووم باغ و بێستان بوو

لە جێی بادی سەبا شەختە نەسیبی نەونەمامان بوو
لە جێی بولبول قەلی ڕوورەش نەوا خوانی گوڵستان بوو

لە ئاگردا ئەوی دەت دی لکی سەروی خەرامان بوو
لە سەر دانگەی، هەڵاڵە و سوێسنە پێ شێلی حەیوان بوو

موختەسەر ئەو دەر و دەشتە جوانە
کوردەواری بوو بە دەس بێگانە

لە کن جەدی و دەلو و حوت وا کرا بوو شەرت و پێش‌بینی
نەبینێ کەس چەمەن زارێک بە زەرد و سوور و و نەخشینی

گەیشتە ئاسمانی شین هەناسەی ساردی سارا و کەژ
کە ڕۆژی دڵ گەرم ئەحواڵی دەشت و کێوی وا بینی

پەنای برد بۆ حەمەل نەورۆزی سوڵتانی خەبەردار کرد
شەماڵی کردە کۆمەک دای بە خۆشی، ئەسلەحەی تینی

وەک پەنا بردنی ئێمە بۆ رووس
تا وەدەس بێتەوە دین و نامووس

لە سەرڕا تیشکی تێگرت ئەو شەماڵ لەو لاوە رایماڵی
پساندی بەندی قەلبی کەویەکان هەور و گۆر و گاڵی

لە دێڕا دەرکرا دەی چوو بە تاڵان تەختی ئیسفەندار
ئەوەندەی قەننەکێشێ سەنگەری بەهمەن کرا خاڵی

لە خاش خاش هەڵکرا بەیداخی سووری فەتح و پیروزی
لە پیرۆزە و زوومەڕڕەد راخرا بۆ شای بەهار قاڵی

دەشت و دەربووکە لە دەس بەفرا دیل
جێژنی ئازادی تێدابوو تەشکیل

هەتا بگرێ تەدارەک خاکەلێوە پێی درا دەستوور
بە باڵای نەونەمامانی بڕی کوتاڵی زەرد و سوور

وەنەوشەی کردە خاڵی سووچی لێوی جۆگەلەی ئاوان
لە مل گیا بەند و خاوی کرد لە شەونم بەندەک و بەرموور

کڵاوی عیززەتی نا سەر سەری داری بەری، سەروی
بە دەف زەن هەڵبژارد و نایە دەس قومری و هەزار سەمتوور

پادشای بانەمەڕی زاهیر بوو
جێژنی ئازادی بەهار دایر بوو

کەدیتم بولبولێک لەو وەختە خۆشەش‌دا دەناڵێنێ
دەسە و داوێنی خارە بۆ گوڵ و ئەشکی دەبارێنێ

کە ئەی بێروحمە ئازەربایجانیش پاش هەموو دیلی
مووەففەق بوو بە خۆشی و بەیرەقی ئازادی دەنوێنێ

ئەمن تاکەی لە زیندانی خەمان‌دا دەستە و ئەژنۆ بم
لە بەر چی وەک گەلی کورد شەش دەرم گیرا لە نەردێنێ

گوڵ گوتی بولبولی کوردستانی
موتریبی کۆمەڵی ژێر دەستانی

گەلی کوردیش بە مەردانە ئەگەر دەس دەن بە دەستی یەک
لە سەفحەی قەلبی خۆیان جوملەیی بوغز و غەرەز کەن حەک

بە یەک ئاهەنگ و یەک ئاوا بکەن هاواری ئازادی
مەتاڵیان کاغەزی رەش بووە بێ نووکی قەڵەمیان چەک

وەک ئازەربایجانی رووس لە سایەی بەیرەقی سووردا
دەبن ئازاد و سەربەستی دەسێنن بێ گومان و شەک

ئەو دەمی دەستەملان بم لە گەڵت
عار نی‌یە لاچووە چڵک و چەپەڵت

دەکا بولبول بە سۆزی دڵ بە ئاهەنگی رەسا فەریاد
خودا یا میللەتی کوردیش وەک ئازەربایجان ئازاد

بکەی تاکوو گوڵێش بێنێتە جێ ئاواتی موشتاقیم
بەسە دەردی من و کورد، من لە دەس هیجر، ئەو لە دەس بێداد

مووەففەق بێ سوپای سوور تا ئەبەد کوردیش لە سایەی ئەو
ببن ئازاد لە ژێر پەنجەی ئەسیری دێوی ئیستبداد

هەر ستالین بژی سەر چاوەی داد
هەڵکەنی زوڵمە لە ریشە و بنیاد

## دیموکراتمان دەوێ

حەو ساڵێ ئاگری شەڕی دنیایە دایسا
دیزەی شەری تیا دەکوڵی گۆشتی پیر و جوان

میلیۆنها جەوانی تەڕ و تازە نەونەمام
میلیۆنها بە عیلم و هونەر نابیغەی زەمان

لەشیان کرابە خواردەمەنی کرم و مار و مۆر
سەریان کرا بە گۆ و لە مەیدان فرێدران

سەدها هەزار شار و دیهات تێکدرا بە بۆم
پیس‌تر لە وەزعی مەملەکەتی کوردی بارزان

بۆچی هەڵایسا؟ لە بەر ئاسایشی بەشەر
ریشەی فەساد و زوڵمی ببەتلێ لە رووی جیهان

میللەت بچووک و گەورە حەققی خۆی وەدەس‌کەوێ
مەئموور و شا لە خۆی بێ چ جایی خەت و زمان

کوردیش ئاخۆ بە شەربوو کەچی هەر دەیان کووژن
وردە و ئەسیرە دێ لە عێراق و لە کوردسان

وا دیارە هی ئەوانە لە بەر نەفعی شەخسی‌یە
کێ راستە قەولی سابیتە بێجگە لە رووسەکان

ئەو لەشکری کە فەتح و زەفەر ناوە، رووسی‌یە
بەیداخی سووری داس و ستارە و چەکوچ نیشان

ئەو لەشکری بە ئەمری ستالینی پێشەوا
بەیداخی فەتح و مەردی لە سەر بڕلەنێ چەقان

ئەو لەشکری کە مستی گرێ کردوە و دەڵێ
زاڵم لە کوێیە تێکی شکێنم دەم و ددان

وا ئەو بەزەی بە حاڵی مەدا هاتووە کە بۆ؟
کورد بێ کەسن لە گێتی و بێ جێن و بێ نەوان

بۆچی دەبێ لە ریزی بەشەر کوردی چارەڕەش
نانی نەبێ زمانی نەبێ تام نەکا ژیان

پێویستە قەومی کوردم وەکوو سایری بەشەر
بەهرەی ببێ لە حەققی ژیان بێتە نێو ئەمان

ئێمەش ئەوا لە سایەی ئەو لوتفی بایەخی
دەستمان بە دەستی یەک دەگرین پاک بە رووح و گیان

حیزبێکی ساز دەکەین و دیموکراتمان دەوێ
فارس چلۆنە کورد دەیەوێ بێ وەکوو ئەوان

مەئموور لە خۆم بێ هەرچی کوتی چاکە تێی دەگەم
خوێندن زمانی خۆم بێ گەلێک زووی دەکەم رەوان

گەر حاسڵم لە خۆمی خەرج کەم چ زوو دەبێ
دانێم مەتەب لە شار و مەکتەب لە دێیەکان

ئەو قەومە پاکی فێری سەواد و عیلم دەبێ
بێگانە چیدی پێم نەڵێ کورد وەحشی‌یە و نەزان

ئەی گەورەکانی کوردی موبارەک بێ کۆمەڵوو
تۆفیقو بێ لە لایەنی خەللاقی بێ مەکان

یاڕەب بژی بە فەتح وزەفەر لەشکری قزڵ
هەر چەرخ و خول بە مەیلی ستالین بدا زەمان

**ئینتقام**

ئاخ چەندە خۆشە لە رێی نیشتمان
وە سوالێ کەوی وەک عیلی بارزان

چەند خۆشە لە رێی نامووس و شەڕەف
ناز و نیعمەتت بڕوا بە تەلەف

ئاخ چەندە خۆشە لە سەر ئازادی
تووشی خەم ببی لە دەس دەی شادی

ئاخ چەندە خۆشە لە رێی وەتەن‌دا
برات ببینی پێ لە پێوەن‌دا

ئاخ چەندە خۆشە لە رێی ویجدان‌دا
خوێنت برێژن لە رووی مەیدان‌دا

ئەمما بەو شەرتە لە دوای رۆژی رەش
شاهیدی مەقسوود بگری لە باوەش

دوژمنت تۆڵەی لێ بکرێتەوە
ئەو داری لێی دای لێی بدرێتەوە

لە جێ دەریان کەی بە ماڵ و منداڵ
لە خاکی غوربەت دەس بکەن بە سواڵ

ناز و نیعمەتیان دەربێنی لە دەس
نەهێڵی بۆ ئاخ هەڵکێشن نەفەس

خەمیان بدەیتێ لە وەختی جەمدا
شەو بنوون لە ژێر لێفەی ئەلەمدا

لاقیان بماسێ بە پێوەندی تۆ
بە سەروانیش بێ چۆن و چەندی تۆ

خوێنیان بڕێژی لە سەر هەرد و بۆ
دایکیان قوڕوەسەر دەس کەن بە ڕۆڕۆ

ئاری، ئینقتام لە سەر رووی دنێ
نیعمەت و خۆشی هیچی ناگەنێ

هەر پیاوێ حیسی تۆڵەی لە دوژمن
لە دڵدا نەبێ کەمترە لە ژن

کوردە گیان بیرێ بکەوە لە خۆت
پێی ناوێ ئەمن شەرحی بدەم بۆت

بەسە با بەس بێ دیلی و ژێردەستی
بەسە بێ بەش بوون لە ژین و هەستی

حەیفە بۆ کوردێ نەجیب و ئەسیل
لە دەس بێگانان وا ئەسیر و دیل

گیانە تا دوژمن سەری ئیشغاڵە
نەردەکەت باشە دوو شەشت خاڵە

باوی بێتەوە وەک تۆوی هەرزن
بڵاوت دەکا لە سووچ و قوژبن

خوێنت دەنۆشن لە جێگای شەڕاب
گوشتت بۆ مەزەی دەکەن بە کەباب

وەک ڕۆژانی زوو ژن و منداڵت
دەگەڵ ئەسیری دەگرین بۆ حاڵت

کوردە نامووسی بێنەوە بیرت
هەستە بۆ تۆڵەت بە خامە و شیرت

یان ڕزگار دەکەی خۆت و وەتەنت
یا خێر لە نامووس دەبڕی کەفەنت

مردن بە شەڕەف خۆشتر لە ژیانە
حیز و سڵامەت نیازی خوێڕیانە

مەرد بن ماندووبن لە ڕێی ڕزگاری
با بیتەکێنین تۆزی هەژاری

## لای لایە

ڕۆڵە ڕووناکی گلێنەی چاوم
بەندی جەرگ و دڵ هێزی هەناوم

ریحانەی بۆن خۆش سوورە گوڵەکەم
ئاو پڕشکێنی کوڵی دڵەکەم

چۆڵەمەی ئەستۆم، رەگی حەیاتم
هەنگوین و قەندم، نوقڵ و نەباتم

خەوی خێرێت بێ بنوە درەنگە
تا کەڵەبابی بەیان بێدەنگە

هەی لایە لایە، ڕۆڵە لای لایە
ئـەمشەو بەزەت بەمن‌دا نایە

ژیر بەوە ڕۆڵەی ژیر و جوانم
لە داخی لانک دەگری دەزانم

دەڵێی بۆ حەپسم بۆ دەستە بەستەم
بەو بەند و حەپسە من جەستە خەستەم

لە نێو کورد نەبێ دەسرازە نی‌یە
ئەو بەند و قلّف و قەڕازە چی‌یە

کوڕم من بیرم لە تۆ زیاترە
دەسرازە و لانک بتبێ چاترە

هـەی لایە لایـە، ڕۆڵە لای لایە
مات بە پێت بلّێم لە بەر چی وایە:

راستە تۆ نەوەی شێری ژیانی
نەتەوەی پاکی گەلی کوردانی

بەڵام چونکە کورد ئەوڕۆ بێکەسە
بەشیان لە دنیا کۆت و مەحبەسە

بۆیە دەت پێچم تا خووی پێ بگری
نەک تا من ماوم لە بەندا بمری

بەو چارە رەشیەت نەماوە تینم
هەر پێم خۆش نی‌یە مەرگت ببینم

هەی لایە لایە، رۆڵە لای لایە
هــەزار تێبینی دوارۆژم لایــە

بۆت بەخت دەکەم عومری درێژم
سەد تاڵی و سوێریت لە سەر دەچێژم

نەمامی باڵات بە فرمێسکی چاو
شەو و نیوە شەو لێی دەنێم شەواو

سەد چاک و پیرت بۆ دەخولێمەوە
لە بن سێبەرت بحەسێمەوە

هەر گەیشتی دوژمنی زاڵم
دەتبرێ و بەزەی نایە بە حاڵم

هــەی لایە لایە، رۆڵە لای لایە
دەک خاک بە سەر خۆم رەنجم بە بایە

پەشێو پێت خۆشە یەخسیر نەمێنی
سەر بەستیت پێ بڵێم بکەویە شوێنی

قەڵەم دەست دەیە و ببە مەکتەبی
وەخت و بێ وەخت لە خوێندن نەبی

ئەو کاتەی لە گەڵ کاکت دوو بە دوو
بکەن هاواری هەققی لە دەس چوو

دەس دەنە دەس یەک بە راو بە تەگبیر
یەکتان بە قەڵەم، یەکو بە شمشیر

هەی لایە لایە، رۆڵە لای لایـــە
شیریش جەوهەریی لە قەڵەم دایە

یەک نامە رەش کا لە داد و هاوار
یەک زەوی سوور کا لە خوێنی بەدکار

یەک لە قورنیشێ بڕوا بۆ تکا
یەکێ قوڕ بەسەر دوژمن‌دا بکا

ئەو پەلەقاژەی ئیستا لە کن من
دەکەی بەند لادەی لە دەست و گەردن

ئەو تەقەلایەت بۆ دوا رۆژ باشە
جوچک هەولێ دە، بێ روحمە واشە

هەی لایە لایە رۆڵە لای لایە
دەس لە دەس تەوفیق لە کن خولایە

رۆڵە نیشتمان چاوی لە رێتە
دایکمان هەویای دوا رۆژی پێتە

بۆیە ئەندامت وەک مینای بێ گەرد
خاوێن رادەگرم بە سەد رەنج و دەرد

چاکەم دەیەوە بۆ وەتەن وەک کوڕ
تۆش بیگەوزێنی لە ناو خوێن و خوڕ

پێت بلێم رۆڵە سەر سوودی چییە
بۆ پردە بازی رێی ئازادییە

هەی لایە لایە، رۆڵە لای لایە
نیشتمان بۆ تۆ دەستە و دوعایە

رۆڵە نامووست وەک خزمەکانت
نەفرۆشی بە پووڵ دەستم دامانت

شەڕەف گەوهەرە قیمەتی نایە
دەویت رووڕەشی هەردوو دنیایە

ئەو کەسە پیاوە بۆ خاک و ئاوی
رۆح دانێ و بە چاک بمێنێ ناوی

نەتبیستوە، واتەی زانای سەرزەمین
مەردانە مردن نەک حیزانە ژین

هەی لایە لایە، رۆڵە لای لایە
بخۆینە نەزان چی لە دەس نایە

راجع بە کورد و ئازەربایجان،

## هەژار و نیشتمان

دوێشەو زۆر بە سۆز کاتی بەربەیان
هاتە گویمناڵە و زایەڵەی گریان

بەو ناڵە خۆشیم نەما لە حاڵا
هێزی لێ بڕیم سۆزی سکاڵا

بەسەد مەرارەت لە بنیانم کرد
دیتم وا دایکی نیشتمانی کورد

دەگری و دەناڵێ وەک هەوری بەهار
رەشی پۆشیوە لە سەر تا بە خوار

هەژار:
دایە ئەی لانکی شێرزاد و شێران
باوەشت جێگای ئازا و دلێران

دەست پەروەردەی تۆ سەلاحەدینە
میری جەزیرت شوهرەی زەمینە

قوباد و باز و میری ئەردەلان
ئەردەشیر، دەیسم شا و کەریمخان

ئاودەل موهەلهەل، لەپزێڕ، شەرەفخان
میری رەواندز، پادشای بابان

خەلیل، زەردەشتت لە ئامیزا دین
جێی خۆشی و فەخرن بۆچی دەکەی شین

نیشتمان:

رۆڵە چۆن نەگریم چۆن نەبارێنم
چۆن خوێناوی دڵ بە چاو نەڕژێنم

نیشتمانێک بم بەو فەخرانەوە
وادیل بم بە دەس فاشیستانەوە

مەزلووم بم بە دەس ئیڕتجاعیون
لێیان شک نەبەم هیچ دەراوی روون

رزق و رۆزی من قووتی تاران بێ
منداڵم برسی لە قون دەرکان بێ

لۆکەم بکرێتە پێخوست لە جادەی
تۆش لێفەت نە بێ بە خۆتی دادەی

لە رەنجبەریتان قاقوم بپۆشن
ئێوەش خوێناوی جگەر بنۆشن

نەشهێڵن بۆ خۆ و بەزمانی خۆتان
دەرس بخوێنن، چۆن نەگریم بۆتان

خۆشکێکم هەیە ئازەربایجان
لە من خراتر کەوتۆتە زیندان

من چم به سەر هات ئەو لە من زیاتر
ئەو لادەکانی لەنگۆ خراتر

لە سەر خۆشم راخەمی ویم زۆرە
دوو خەم بە جارێک لە دڵ ناسۆرە

گەر هەوڵێ نەدەن بۆ نەجاتی مە
دەبێ جاو بێنن بۆ خەڵاتی مە

هەژار:

نیشتمان بەسیە گڕم تیبەربوو
قەولت پێدەدەم پیاوانە تاکوو

خاکی کوردستان لاو چاکی ببێ
ئازەربایجان خوێن پاکی ببێ

نایەڵین بمرن دەستی ئیتتحاد
دەدەین بە یەکتر بۆ ڕێگەی مراد

خوێنمان لە تەشتێ دەبێ برێژن
پاکمان لە جێیەک دەبێ بنێژن

وێگرڕا هەوڵ ئەدەین بۆ رزگاریتان
هەر دوو دەستێنین خودموختاریتان

ئێوەش بە جووتە مەگرین دوعا کەن
روو لە بارەگای بەرزی خودا کەن

بپاڕێنەوە بە سۆز و ناڵین
تا دەور ئەدا چەرخ بژی ئیستالین

هەر مووەففەق بێ لەشکری قزڵ
تا هەژار بگەن بە ئاواتی دڵ

## ئینقلابی ئوکتۆبر

ئەگەر قەدر و گیتی دروست کرد خوا
لە بەر وەی هەموو کەس دەستی لێنەدا

بە حیکمەت تەلسمێکی پێ بەستووە
کە ئیقدام و غیرەت کلیلی ئەوە

ئەوی غیرەت و هیممەتی تەوئەمە
جیهانداری و گەورەیی هی ئەمە

لە ئادەم هەتا دەوری مە وابووە
ئەوی غیرەت و هیممەتی لابووە

هەموو نیاز و ئاواتی پێک هاتووە
تەمای هەرچی بووبێ دەستی کەوتووە

کوڕی هیممەتە حوکمی سەر عەرز ئەکا
فەقەت هیممەتە پیاوی سەربەرز ئەکا

زەمانێ لەمەوبەر هەموو شۆڕەوی
وەکوو کوردستان بوو، بە دەس پەهلەوی

ئەوەند نانی پەیدا دەکرد کاردار
تەواوی دەجوورا بە زاری تەزار

بڵند بوو وەکوو شێری لانێ (لێنین)
لە لای بوو کلیلی تەلسمی زەمین

لە خۆی کۆوە کرد کۆمەڵێ لاوی پاک
لە مەیدانێ خستی لە زاڵم کەلاک

ئەوی سەر رەقی کردبوو نەرمی کرد
ئەوی خوێنی خەڵکی مژی چەرمی کرد

فرێی دا درِ و داڵی جەور و جەفا
چەقاندی لە جێی باغی سوڵح و سەفا

هەموو کەس وەکوو یەک تەماشا کرا
بەغیلی نەما پاکی بوونە برا

به جارێ هەموو دەستی دا ئیش و کار
نەما رۆژی هار، بوو بە باوی هەژار

دەڵێی گەر ئەوان وا بە دڵ هەوڵ ئەدەن
بە میلیۆن دوسەد رووحن و یەک بەدەن

لە نێو چاڵی مەزڵوومیا چوونە دەر
بە ئەوجی تەرەققی گەین سەربەسەر

لە خۆ سەهلە رێگا بە زوڵمی نەدەن
لە مەزلوومی دیش دەفعی زوڵمێ دەکەن

لە گیتی لەکن گەورەیی شۆڕەوی
هەواو گەورەیی خەڵکیە مونزەوی

هەموو ساڵی جەژنێ دەکەن کارگەر
کە لەو رۆژە شایان دەفع بوو لە سەر

لینین مرد بە مەرگێکی پڕ ئیفتیخار
ستالینی دانا لە سەر کار و بار

به ساكاری ئەو پارچەكەی كردە كار
ستالین پڕی كرد لە نەقش و نیگار

ستالین نەبەردێكە باسک قەوی
سەری سەر بڵندان لەڕووی وی نەوی

ستالینە ریشەی یەكی و ئیتتحاد
ستالینە سەرچاوەی عەدل و داد

ستالین بڕی ریشەی زوڵم و شەڕ
كە ئاونۆش دەكەن پێكەوە گورگ و مەڕ

ستالینە دەكوتێ سەری زاڵمان
ستالین دەزانێ چی‌یە حاڵمان

هەتا عەدڵە مەحبووبی سەرڕووی‌زەمین
روحت شاد و جاویدە نێوت لینین

هەتا هەن لە دنیایە لەیل و نەهار
ئیستالین بژی بۆ پەناگای هەژار

## غەزەل

ئەریٚ ئەی کیژە کوردەی چاو کەژاڵە
ئەریٚ ئەی شۆخ و شەنگی چاردە ساڵە

ئەتۆ خۆت کورد و خوێنی لاوی کوردان
بە تورکی چاوی مەستت کرد حەواڵە

بە خوێنی مەی دەدەی ئاوی مژۆڵت
بژانگت بۆچی سەر نێزەی کەماڵە؟

رنووی سەر ئاگرین لاجانگ و کوڵمت
لە خوێنی نەوجەوانان دا شەڵاڵە

بڵێی ئێران و عارەب بیٚ، دڵی تۆ
کە لێی تەئسیری ناکا ئاهDEL و ناڵە

مەگەر چاڵی چەنەت زیندانی قەسرە؟
کە رزگار بوونی ئێمەی لیٚ مەحاڵە

تەنافی زولفت ئاوێزانی باڵات
نەمانی هاونژادانت خەیاڵە

روحت بردم بە قەندی لێوەکانت
دەزانی کورد بە قەند وێرانە ماڵە

قەباڵەی ئاشقیم زۆر موعتەبەر بوو
چ قەوما چاوم ئەمڕۆ پێت بە تاڵە

لە ئاهDEL و ئەشکی بێ چاران حەزەرکە
وەئەستۆ مەگرە چیدی ئەو وەباڵە

مەگەر ترست نی‌یە دەستی زەمانە
وەرێت بێنێتەوە ئەم ژینە تاڵە

کوڕی شێران و ئەفسەح بووم بەدەس تۆ
هەژارێکم زمانم لەنگ و لاڵە

## سووره گوڵەی باخی کوردستان

نەسرینی قوندیلانە و نازاری نۆجوان
چاتر نموونە سوورەگوڵەی باخی کوردسان

کوڵمت گەش و بەتینە وەکوو جەوری موستەبید
پرچت رەش و درێژە وەکوو رۆژی کوردەکان

قەددت حەقی ژیانی هەموو میللەتی بچووک
ئازادی کوردستانە دەمت، لێی نی‌یە نیشان

دوژمن بە تانگ لە سەرتە ئەتۆ تازە سازدەکەی
لەو قەرنی بیستە تیری مژۆڵ و برۆی کەوان

چاوت هیمالی بەختی منە رۆژ و شەو بە خەو
نازت میسالی دەردی منە دەم بەدەم گران

ئەگریجەکەت کە دێتە نەزەر رووتی گرتووە
دڵ ژان دەکات و دێتەوە بیر وەزعی نیشتمان

بەو کیژیەش دەزانی کە هاوخوێنی خۆت نەبێ
نابێ بە یاری بگری، هەژار بەسیەتی ئەمان

چەند شیعری بلاو   نەکراوە

**ئاڵای کوردستان**

بێ ببینێ ئەو کەسەی پێی وابوو کورد سەرناکەوێ
کێ بوو پێی وابوو تەمی نەگبەت لە سەرمان ناڕەوێ

داری ئاڵاکەم وەکوو چقڵێکە بۆ چاوی عەدوو
هەر دڵێ خۆشی نەوێ رەبی وەبەر خەنجەر کەوێ

داری ئاڵام داری کرد بۆ خوێنمژی کوردی هەژار
پێی بڵێن با داکەوێ لەو خاک و خۆڵە چی دەوێ

داری ئاڵاکەم برا، سێدارەیە بۆ دوژمنان
هەر لە ئاسو سەر کەوێ پێویستە ژینی خۆی نەوێ

پارچەکەی سێرەنگی خۆی دەنوێنێ و رەنگی سووردەڵێ
تا تنۆکێ خوێنی کورد مابێ قەدی من نانەوێ

یان دەڵێ لێم سوورە دیموکراسی لە عالەم سەرکەوێ
موستەبید و مورتەجیع کەوتوونە گێژی گێژەوێ

سپیەکەی موژدەی بەیانی بەختی کوردی کرد بەیان
رۆژی بەختی کوردە پەیدا بوو نەما پەردەی شەوێ

دوو گوڵی گەنمی دەڵێ ئاگات لە رزقی خۆت ببێ
خۆت کە برسی بۆچی دوژمن پێی بژی لێرە و لەوێ

پێت دەڵێ نووکی قەڵەم گەر ژینی خۆشت پێدەوێ
غەیری من دەس ناکەوێ بۆ رێی تەرەقی پێشرەوێ

رەنگی سەوزی یانی دایکی نیشتمان لەورۆکەوە
جوان و سەر سەوزە وەگیری کەوتووە عومری نەوێ

لاوەکان نامووسی نۆملیۆنە ئەو ئاڵایەمان
گیان بدەن بۆ حیفزی ئەو نامووسەتان لە منو کەوێ

رەبی هەر کەس دوژمنی ئەو میللەتە دڵ پاکەیە
ژێر کەوێ کۆستی کەوێ رەبی سەعاتێک نەسرەوێ

**دەمەتەقەیٚ نێوان هاوار و بایز**

هاوار:

من ڕەنجبەرێکم بە ڕەنجی بازوو
ئارەق ئەڕێژم ڕۆژ و شەو، ماندوو

زستان دارکەر و بەهار شوانم
پایز جوتیار و هاوین سەپانم

سانەوەم نیە لە ساڵێک ساتیٚ
نەک ئاغام زویر بیٚ و نانم نەداتیٚ

حەڵقەی غوڵامی، ئاغام لە گوێیە
چی ئەو بفەرمویٚ بەریٚ و جێیە

زۆر جار، لە مەلای گوندم بیستیە
ناحەزی ئاغا، تەڵاقی نی‌یە!

بایز:

هاوار! نازانم کە تۆ رەنجبەری
کورێکی ئازاو ژیر و ئیشکەری

لە ساردی و گەرمی ئارەق ئەڕێژی
لە شیرینیا تاڵی ئەچێژی

کەوایە، بۆچی، رووت و هەژاری
مەگەر گیرۆدەی دەستی زۆرداری

رزگاریت نیە لە دیلی و بەندی
کەوابێ بۆچی؟ تۆ هونەرمەندی

هاوار:

بایز گیانەکەم، گوێ بگرە برات
من رەنجبەرێکم ماندوو بێ ئاوات

چی لە رۆژاوا، چی لە رۆژهەڵات
چی فێر کراوم، عەزمم بێ و سوبات

چیم پێ ببێژن، فەرمانڕەوا بم
هەر چۆنی بڵێن ئەبێ وەهابم

خاوەنی فەرمان ئەو ئەمژێینێ
ئیشی بۆ ئەکەم خوێنم ئەرژێنێ

بایز:

هاوار! ئەزانم زۆر بەختیاری
لە جێی ئیش کردن، یەکجار بە کاری

ئینتاجی زەوی تۆ دەینێی بەرهەم
کەچی حەرامە، لە تۆ زۆرو کەم

تۆ لە بەر هەتاو زەحمەت دەکێشی
ئەو لە سێبەرا بە کەیف و خۆشی

خاوەنی ئاوو زەوی درۆیە
کە تۆ رەنج بدەی حەڵاڵی تۆیە

هاوار:

بایز! ئەڵێی کەی دەبم بەختیار
کەی رزگار دەبم لە ئەرک و ئازار

ئەبێ هەتاکەی هەر خزمەتکار بم
هەر رەنجەڕۆبم، برسی و هەژار بم

ئەبێ تا ماوم هەروا بێ حاڵم
هەر رووت و قووت بین، خۆم و مناڵم

هەر کردەوەی من، بردەی ئاغابێ
هەتاکەی ئەبێ، ئەم کارە وابێ

بایز:

هاوار! هەمیشە تۆ بەختیاری
چونکە دوچاری ئەرک و ئازاری

تۆ کە رەنجبەری بۆ خزمەتکاری
کە خاوەند ئیشی، بۆچی هەژاری

گەر ئارەزووکەی، وانابێ حاڵت
رووت و قووت نابێ، ماڵ و مناڵت

کەی هەستت پێکرد، زۆر لێکراوی
بەختیار ئەژی، ئیتر، تا ماوی

**برایەتی ئازەربایجان و کوردستان**

بخوێنە بولبولی خوێنگەرم و دڵسۆز
لە شادیانەی بەهار و جێژنی نەورۆز

ئیتر سەرمایی زستانی بەسەرچوو
ئەوی تۆی دڵ بە غم کرد، تازە دەرچوو

بە خێر چوو تاو و باو بارانی سەرما
لە هەر گۆشە و کەنارێک بێ ئەسەرما

دیسان وا خاکی خۆی دەسکەوتەوە گوڵ
جێگەی چاکردەوە بۆ تۆش لە سەر چڵ

گوڵی جاران نیە تووشی خەمت کا
لە گەڵ هیجران و دووری هاودەمت کا

هونەروەر پەروەرەو زانا پەسندە
لە مەشدا وا کەش و وا سەربڵندە

له تۆش زیاتر ئەمن مەسروور و شادم
سروود خوێنێکی خاکی پاکی مادم

هەتا وێستا منیش یەخسیر و دیل بووم
له بەندی ئیرتجاع مات و زەلیل بووم

وڵاتی گرتبووم بەفری هەژاری
کڕێوەی نەگبەتم پێدا دەباری

له سایەی کۆمەڵی پاکی دێموکرات
به ئاواتی دڵم گەیوم به ئاوات

مژی خەم به شنەبای ئاگرادی ڕۆیی
له سەر (سابلاخە) ئاڵای سەربەخۆیی

چ ئازادی هەتا وێستا ئەگەر کورد
له ڕێی ڕزگاریا دەیکرد دەسوو برد

به تەنها هۆزێ یاخۆ پۆله سوارێ
به شیر و خەنجەرێک و بەردوداریێ

دەهاتە کار و هەر بەم جۆر و تەرزە
تەواوی هەر دوبۆی دێنایە لەرزە

ئەوێستا سەربەسەر کوردی وڵاتی
رەعیەت، عاشیرەت، شاری، دێهاتی

لە سایەی پێشەوای زانا و هونەروەر
هەموو پێشمەرگە و گیانبازە یەکسەر

ژن و پیاو، کچ و کوڕ، گەورە و ورد
بە خوێنگەرمی بە یەک ئاواز دەڵێن: کورد

هەموویان بێچوە شێری سەفشکێنن
هەموو دۆست هێنەر و دوژمن رفێنن

بە چاتر ئەسلیحە تەجهیز کراون
بە چاتر تەربیەت تەعلیم دراون

نەخوازە ئەمڕۆ لوتفێکە خودایی
کە ئازەربایجان، دەستی برایی

له گەڵ کوردی بە راستی ناوەتە دەست
کە ئیستعمار بکەن بەربەست و بێهەست

چ ئازەربایجان، ئاگرستانە
ئەوی دەیبینی وەک شێری ژیانە

لە رێگەی نیشتمان پاکی فدایین
نیفاق سووتێن و داخوازی برایین

دەسا کێیە بکۆخێ رووبەروومان
مەگەر وەک سەگ بقۆڕێنن لە دوومان

میسا لە گەر برا یاری برابێ
لە لای خوا را مەگەر دەرد و بەڵابێ

وەرە بولبول مەبە چی دیکە خامۆش
لە تۆ دەنگ و لە من شێعری تەڕ و خۆش

خودا ئەو دوو گەلانە بەختیار کەی
بە جێی وان داخ لە دڵ هەردەم هەژار کەی

## فه رهه نگۆک

ماوەت: پارچەیەکی کولّکنەدەکرێتە کەواو و پاتۆڵ.

سەڕسەڕ: بای ساردی بە تەوژم.

ئاوڕیش: بە گژ دا هاتنی بێ سەبەب.

غورڕابی خەو: شیرنە خەو.

نەتەوی: دوژمن.

مێوەڕون: مەڵحەمێکی بە پێستاساوینە.

حیبر: جەوهەر.

جەدی: بەفرانبار هەوەڵ مانگیزستان.

حوت: سێهەمین مانگی زستان(ڕەشەمە).

خەتا: مەبەست، مەڵبەندێکە لەبەشی تورکستان چین و ئاسکی ومیسکی ئەو ناوچەیە بە ناوبانگە.

دەلو: دووهەمین مانگی زستان(ڕێبەندان).

حەمەل: هەوەلین مانگی بەهار(خاکەلێوە).

پێوەن (پێوەند): زنجیری قاچیئەسپ و زیندانی.

هەرد و بۆ: وڵات، سەرزەمین.

دنێ: دنیا.

دەویت: دویت، بێناموس.

کۆت: داری ئەستووری قاچیزیندانی.

واشە: باشوو.

پێخوست (پێخوس): بەرپێدراو، پێ ڕێ خراو، پێپەست.

قاقوم: گیانەوەرێکە لە تیرەی‌سمۆرە، کە دەگەڵ گیا ڕەنگدەگۆڕێ و پێستەکەی زۆر بەنرخە.

وردە: خرات و پرت.

زویر: ناقایل، خەمگین و مات.

داشداری: لایەنگری،ئاگاداری، پارێزگاری.

لیس: داری درێژی لە بڵنداهەنگێو داو کە مریشک وقەلەموونە شەوانە لە سەری‌دەنیشن.

زەرنیق: جۆرێ گۆگرد.

پیک: کوتکی ئاسن.

رژد: هەورازی کووڕ.

قۆرت: بەڵا و چۆرتم.

بەیداخ: ئاڵا.

دهۆ: فێڵ.

داڵدە: پەنا.

رنوو: کەویە بەفر، کلێڵە.

دەجاڵ: دەعبایەکی سەیر وسەمەرە و فێڵبازە لە ئاخرزەمان پەیدا دەبێ.

باهۆ: شان و پیل.

هەژگەڵ: چڕ و چیلکەی‌ئاوردو.

یانە: ماڵ، خانوو.

مەتاڵ: سپەر.

میسک: مۆشک، شتێکی بۆنخۆشە لە ناوکی ئاسکیدەگرن.
لە بنیانم کرد: تێگەیشتم،بنەماکەیم دۆزیەوە.

بۆ بیرەوەری لە رۆژی دیلی
بۆیادی دەمی کزی و هەژاری
ئەی وینە لە باتی من بمێنە
بۆ لاو و کچانی کوردەواری

ئەو رۆژی ئەوان وەدەستیان دێ
سەربەستی و ژین بە رەستگاری
بیرێکی بکەن لە دڵی پڕی من
تووش نەبنەوە دەردی لێو بەباری